# پێوەرەکانی سەرکەوتنی
# ڕێکخستن و دوانەییە سەرەکییەکانی

.............................................................

لەبڵاوکراوەکانی ناوەندی هزیی و ڕۆشنبیریی خاڵ (٣)

**نووسینی:** محمد مختار الشنقيطي
**وەرگێڕانی:** تۆفیق کەریم
**دیزاین:** ڕەوشت محەمەد
**تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
**چاپخانە:** تیشك

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە(١٨٣٠)ی ساڵی ٢٠١٦ی پێدراوە

# بەرایی

ڕێکخستن (کاری بەکۆمەڵ)[1] چیدی بەهرەیەکی تاکەکەسی نییە بەندبێت لەسەر کاریزمایی کەسایەتییەك، بەڵکو زانستێکی ریشەدارە و بنەما و یاسای خۆی هەیە، ئیسلامخوازان دەبێت وەریبگرن، چونکە خزمەتکردنی ئایین بە هۆکاری دواکەوتوو لەسەردەمی خۆی، رەنج بەزایەدانە و ناگاتە ئامانج، لەوەش خراپتر کاریگەریی نەرێنی لەسەر تێڕوانینی خەڵکی دەبێت بۆ ئایین و نائومێدیان دەکات کە لە سایەیدا دادگەریی بێتەدی.

---

[1] هەرکاتێك نوسەر دەستەواژەی ڕێکخستنی بەکارهێنابێت مەبەست پێی کاری بەکۆمەڵە جا حزب بێت یان ڕێکخراوێك یان هەرکارێکی کۆمەڵکاری.

ئەمەی بەردەستت شەش پێوەرە بۆ سەرکەوتوویی ڕێکخستن، دەگونجێت بشێن بۆ حوکمدان لەسەر ڕێکخستنە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان بەگشتی، بێئەوەی بچینە ناو وردەکاریی و تایبەتمەندیی هەریەکەیانەوە، پاش ئەو شەش پێوەرەکە، ئەو دوانەییەنەمان لەسەر بنەمای خوێندنەوەی خۆمان بۆ ئەزموونی بزووتنەوە ئیسلامییەکان لە هەشت دوانەدا کورتکردووەتەوە: شێوە و ئامانج، نهێنی و ئاشکرا، ستونی و ئاسۆیی، گشتیی و تایبەتی، جیاوازی و گۆشەگیری، پابەندی و دەستپێشخەری، بچڕاندن و گەیاندن.

جا با لە پێوەرەکانی سەرکەوتوویی ڕێکخستنەوە دەستپێبکەین.

# پێوەرەکانی سەرکەوتوویی ڕێکخستن

## یەکەم: پێوەری نەرمکێشی ( المرونة )

هـــەتا ئاســـتی مرونـــەت بـــەرزتر بێـــت، ئەگـــەری سەرکەوتنی رێکخستن زیاترە، مروونەتیش سێ جۆرە:

* نەرمکێشی ئەرکباری (التکلیفی)، کە بەستراوە بـە ئامـــانج و ئەرکـــەکانی رێکخـــستنەکەوە، بەشـــێوەیەك رێکخراو بتوانێت هەندێ ئامانجی تـەکتیکی و کورتخایـەن و ئەرکی کرداریی کە جێبەجێکراون یـان لـە توانـادا نییـە جێبـەجێ بکـرێن بگۆڕێـت بـۆ کۆمـەڵێك ئـەرك‌و ئامـانجی گرنگتر کە ئاسانتر جێبەجێ دەکرێن لە بارودۆخی نوێـدا، جا هەر رێکخستنێك نـەتوانێت خـۆی لـە هەنـدێك ئـەرك‌و ئامـانجی قۆناغبەنـدیی قوتـار بکـات و ئـەرك‌و ئامـانجی گونجاوتر لەگەڵ بارودۆخدا هەڵبژێرێت، بەدڵنیاییەوە ئەو رێکخـــستنە مـــەحکومی چەقبەســـتوویی و مـــەرگێکی هێواشـە، بـەڵام خـۆ قوتـارکردن لـە کۆمەڵـە ئامـانجێکی

کاتیی یان هەندێك ئەرکی کرداری هەرگیز مانای خۆ قوتارکردن نییە لە بنەما و ئامانجە باڵاکان، کە پاساوی بوونی ڕێکخستنن.

* نەرمکێشی ڕێکاریی (ئیجرائیی) کە پەیوەستە بە پەیکەر و بینای ڕێکخستن و ڕێکارە ناوخۆییەکانەوە سەبارەت بە گۆڕینی سەرکردە و بڕیاروەرگرتن، واتە ڕێخستن بتوانێت بە ئاسانی و بێ گرێ و گۆڵ گۆڕانکاریی لە سەرکردایەتییدا بکات، بەوەی دەرگای گەیشتن بە سەرکردایەتی و لێدەرچوونی بکاتەوە، لەسەر کۆمەڵە پێوەرێکی بابەتی نەك شەخسی، بێ ئەوەی کەس لە کاروان دابڕێت و ریزی ڕێکخستن پەرتبکرێت، پشتوانیت بڕیاری گونجاو لە کاتی گونجاودا بێ دڵە لەرزە و گرێ و گۆڵ بدات.

* نەرمکێشی کرداریی کە گونجاندنی ڕێکخستن لەگەڵ پێشهاتە گۆڕاوەکاندا بەشێوازێکی ناجێگیر، بێ خۆبەستنەوە بەشێوازی ڕابردووەوە، با پێشتر سەرکەوتنیشی بەدەست هێنابێت، بەڵکو جاری وا هەیە

سەرکەوتوویی جاری پێشوو کە لە دۆخێکی جیاوازدا روویداوە دەبێتە فریودەر تا لە دۆخێکی جیاتر لەوەی رابردوو دووبارە بکرێتەوە، بەمەش لێرەوە هەڵەکە روو دەدات و ڕێکخستن دەبێتە قوربانی سەرکەوتن و شانازییەکانی رابردووی.

## دووهەم: پێوەری یەکڕیزیی

چەندە ڕێکخستن پتەوبێت، ئەوە نیشانەی سەرکەوتوویی و گونجاوی بەرەو پێشچوونیەتی لە بەرامبەر پێشهاتەکان، یەکڕیزیی ناوخۆیی بە ئەندازەیەکی زۆر پێویستی بە کۆڕایی ناوخۆیی لەسەر سێ خاڵ هەیە، کە ئەمانەن:

* لەسەر سروشت و پەیامی ڕێکخستن، نەك تەنها لەسەر ئاستی ئامانجە باڵاکان و هۆکارەکانی بوونی رێکخستن، چونکە ئەوانە تیۆرین و رێکەوتن لەسەریان ئاسانە، بەڵکو لەسەر ئامانجە کورتخایەنە بنەڕەتییەکان

و ئامرازە کاریگەرەکانیش کە دەبێت بەکاربهێنرێن بۆ گەیشتن بەو ئامانجانە.

* لەسەر سەرکردایەتی ڕێکخستن، پەیکەر و دەسەڵات و کەسەکانی، ئا ئەمە ئەو شەرعیەتی ناوخۆییەیە کە دەبێتە گرەنتی یەکڕیزیی و بنەمای یەکگرتوویی.

* لەسەر چارەسەری کێشە ناوخۆییەکان لەسەر کۆمەڵە بنەمایەکی هاوڕایی، بەجۆرێك جیاوازییەکان بەشێوازێکی ئاشتییانە و نەرمکێشیەوە چارەسەر بکرێن و ترازان لە پەیکەری رێکخراو و لەمپەر لەبەر ڕێی کاروانەکە یان لادانی لە خولگەی خۆی روو نادات.

## سێیەم: پێوەری سەربەخۆیی

مەبەست پێی ئەوەیە کە ڕێکخستن قەوارەیەکی مەعنەوی و کەسێتیەکی ئیعتیباری سەربەخۆی هەبێت، جیا لە تاکو پێکهاتەکانی، بەشێوەیەك بوون و کارایی ئەو نەوەستێت لەسەر بوونی هیچ هێزێکی دیکە،

نەشکرێت بە ئامێرێك بۆ خزمەتی هیچکامیان، بەڵکو تەرخان بێت بۆ خزمەتی ئەو ئامانجانەی لەپێناویدا دروست بووە، جا هەر ڕێکخستنێك سەرکردایەتییەکەی یان تاقمێك ـ بنەماڵە و خێزانێك ـ یان هەر ئاراستە و چینێك بتوانن لە بەرژەوەندی خۆیان بەکاری بهێنن لەسەر حسابی پەیام و ئامانجە گشتییەکانی ئەو ڕێکخستنە هەرگیز سەربەخۆ نییە.

ڕێکخستنی سەربەخۆ ئەوەیە سەرجەم تاکو هێزە کۆمەڵایەتییەکان لە سایەیدا بن و خزمەتی بکەن بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی، لەو کاتەدا ڕەنگە تاکەکان یان تاقمێك لە سایەیدا سوودمەند بن، بەڵام ئەگەر کەسانێك یان تاقمێکی پێکهێنەری ڕێکخستنەکە ئامانجەکانیان لە باڵاتریان لە ئاستی ئامانجی خودی ڕێکخستنەکەدا بن، ئەو کاتە ڕێکخستن پێوەری سەربەخۆیی لە دەستداوە.

## چوارەم: پێوەری پێکهاتە

مەبەست پێی: بـەهێزتر کردنـی (مـضاعفة) پەیکـەر و جۆر و لقەکانیەتی، ئەمـەش پێکهاتـەی ئـەو جیاوازییانـە دەگرێتەوە کە لە نێوان بنچینە و یەکەکانی ڕێکخراودان و دەبێـت کـە لـە ڕووی پەیکـەر و ئـەرك و جوگرافیـەوە لـە تەواوکاری و هاوسەنگی نێوانیاندا لەیەك جودا بکرێنەوە، بەوەی هەندێکیان پاڵ بدەیت بە هەندێکی دیکەیانـەوە و هەندێکیشیان کاریگەریی بێت لەسەر ئـەوانی دیکـە، ئـەم جۆرە پێکهاتەیە هاوکار دەبێت تـا ڕێکخـستن ناسـنامەی شەخسی سەربەخۆی خۆی بنیات بنێت و خۆی قایمکـات و بەردەوام بێت، کەسـایەتیە ئیعتیبباریەکـەی بەرجەسـتە ببێت، تا بوونی نەبەسترێتەوە بە بوونی هیچ سەرکردە و دامەزرێنەر و نەوەیەکەوە، هەروەها کاروانەکەشی پێیـان نەبەسترێتەوە.

جاری وا هەیە ئەم شـێوە پێکهاتەیـەی ڕێکخـستن بـە دڵی ئەو سەرکردایەتیە نییە کـە خولیـای دیکتاتۆریـەت و زەوتکاریان هەیە، بۆیە ڕێکخستنەکانیان بە شـەپڕەوی و

سادەیی دەهێڵنەوە تا بتوانن بەکاریان بهێنن، بەڵام ئەوانە هێندە خزمەت بە دەسەڵاتی شەخسی بەرتەسکی خۆیان دەکەن، ئەوەندەش ڕێکخستن وەك دامەزراوە کزو لاواز دەکەن.

## پێنجەم: پێوەری ئیستیعاب (لەخۆگرتن)

ئامانج لە پێکهێنانی هەر ڕێکخستنێك هەستکردنە بە پێویستبوونی ڕێکخستن کۆ و وەزکان و ڕێنمایی و پتەوکردن و ئاراستەکردنیان بەرەو مەبەستێکی هاوبەشو خۆلادانە لە بەزایەدان و تێکگیران و جوینەوەی وزەکان، بەوەی بە هەرەمی هەموو بەرەو یەك جێگا ببڕێت بە تەنسیق و ڕیتمێك، جا ئەگەر ڕێکخستنێك توانی ئەندامەکانی خۆی کۆکاتەوە و تواناکانیان ڕێکبخات بەشێوەیەك هەرکەس لە شوێنی شایستەی خۆی بێتو هەست بە پەراوێزخستنو مەزلومییەت نەکات، ئەوە نیشانەی ئەوەیە ئەو ڕێکخستنە بە ئاراستەیەکی راستدا دەڕوات، بەڵام ئەگەر پێچەوانەکەی روو بدات و بەشێك لە

ئەندامان متمانەیان بە ڕێکخستنە نەما، جا بەهۆی لاوازی باوەڕ بوو بە ئامانجەکانەوە یان کەمبوونەوەی متمانە بە سەرکردایەتییەوە، بەهۆی هەست بە ستەمکردن یان خراپ ئاراستەکردنی تواناکانەوە، ئەوا ئەو ڕێکخستنە ئاراستەیەکی هەڵەی گرتووە.

بەڵێ ئەگەر سەرکردایەتی هەر ڕێکخستنیك توانای ئاراستەکردنی وزەی ئەندامانی نەبوو ریکیانخات و پێکەوە بیانگونجێنێت، پێکدادان و جوینەوە و لاساییکردنەوەی یەکتری باڵی کێشا بەسەریدا، ئەوە ئامارەیەکی نەرێنییە و نیشانەی ئەوەیە ئەو ڕێکخستنە بەرەو بێ شیرازەیی دەڕوات و پەیامی خۆی لەدەست دەدات، دەبێت بە کۆتێك لەسەر وزەی ئەو ئەندامانەی کە پێشتر هۆی ڕێکخستن و رێنماییان بووە.

## شەشەم: پێوەری ئەرێنی

مەبەست پێی ئەوەیە کە ڕێکخستن جڵەوی دەستپێشخەری لە کاروبارەکانیدا دەستپێوەبگرێت و بەئیجابی لەگەڵ گەشەسەندنەکانی کۆمەڵگەدا هەنگاو هەڵنێت، ئەمە تاکە دەروازەیەکە لێیەوە بە سروشتی گەشە دەستێنێت نەك بە بازدانی گەورەی کتوپڕی بێ بەرنامە، یا خاویەکی چەقبەستوویی و مانەوە لە پەراوێزی کۆمەڵگەدا، ئیجابیەتیش پێویستی بە ئەندازەیەك واقیعی بوون هەیە، ڕێکخستن لەگەڵ خراپە هەڵدەکات لە پێناوی گۆڕینیدا، نە لە خەڵك بێ ئومێد دەبێت و نە پەلەیەکی سەرەڕۆیانە دەکات و نە لە کۆمەڵگە هەڵدەگەڕێتەوە، بۆشاییەك ناهێڵێتەوە هۆکاری خراپە و سلبی لێیەوە دزە بکەن و ریشە داکوتن، باوەڕی بە هەوڵدانی بەردەوامە هەرچەندە کەمیش بێت، باوەڕیشی بە بوونی بێ دەنگی کارا و ڕێگەبڕینی پلەبەپلە هەیە بۆ گەیشتن بە ئامانج.

ئەمانە بەوە دەبن کە لە هۆکارەکانی هێز و لاوازی کۆمەڵگە و لایەنەکانی گەشەسەندن و دواکەوتنی کاروان و هۆکانی دەستخستن و کاریگەریی بگەین، لەگەڵ ئاگاداربوون لەهەر دەلاقەیەك کە دەکرێتەوە و قۆستنەوەی هەر دەرفەتێك کە دەڕەخسێت.

پاش ئەوەی لە هەندێك پێوەری سەركەوتنی ڕێكخستن دوایین، هەشت دوانەیی ڕێكخراو دەخەینەڕوو، كە بە لەمپەری فیكری و كرداری بزووتنەوە ئیسلامییەكان دادەنرێن كاروانی هەموو بززوتنەوەیەك لەسەر شێوە و چۆنیەتی مامەڵەكردن لەگەڵ ئەم دوانەییانەدا وەستاون.

# دوانەییەکانی ڕێکخراوەیی
# ڕواڵەت و ئامانج

یەکەم گرفتی بیری ڕێکخراوەیی کە تووشی بزووتنەوە ئیسلامییەکان دێت، دوانەیی ڕواڵەت و ئامانجە و ئەو شوێنەوارانەشە کە لەسەریان دادەمەزرێت، چونکە بنەما لە ڕێکخستنی بزووتنەوە ئیسلامییەکاندا ئەوەیە کە هۆکارێکن بۆ خزمەتی ئایین و یەکخستنی تواناکان، بەڵام جارجار لە بیری خەڵکێکدا ڕواڵەت دەبێت بە ئامانج و مەبەست، بەتایبەت ئەگەر ئەم ڕواڵەتە لە ماوەیەکی کاتیدا سەرکەوتنی بەدەستهێنا، جا زۆر لە بزووتنەوە ئیسلامییەکان تووشی ئەم دەردە بوون، دەردی دەستگرتن بە ڕواڵەتەوە لەسەر حسابی ناوەڕۆك و سووربوون لەسەر شتە رووکەشەکان زیاتر لە شتە جەوهەرییەکان.

ژیان کە هەمیشە لە گۆڕاندایە پێویستی بە داواکـراوی گــۆڕاویش هەیـــە، بۆیـــە دەســـتگرتن بـــە ڕواڵـــەتی ڕێکخراوەییــەوە ئەگــەر پێویــست نــەبوو دەبێتــە هــۆی دواکەوتن و چەقبەستوویی و گەشەسەندنی بزووتنەوەکـە دەوەستێنێت، لەڕاسـتییدا موحەممـەد ئیقبـاڵی شـاعیر و فەیلەسوف جوانی وتـووە کاتێـك ئامۆژگـاری مـسوڵمانان دەکـات کـە لـە بریـقو بـاقی کـێلان خـۆی قوتاربکـەن و دەست بە مشتی شمشێرەوە بگرێن:

**عصاك تصدع صم الجبال**

**وتعرف سيناء صدق الكلام**

**فدع تعرف العمد، ما للهلال**

**على فخره غير شكل الحسام**

جەدەلیەتی ڕواڵەت و ئامانج تەنها گرفتێکی کردەیـی نییە، بەڵکو گرفتێکی راستەقینەی فیکریشە، پەیوەستە بە پەیوەندی نێوان بیروباوەڕ و ڕێباز و نێوان مەبەسـتو هۆکـارەوە لـە کـاری ئیـسلامیدا، هـەر تێکـەڵکردنێك لـەم

بوارەدا روو بدات لادانی فیکریی تێدا دروست دەبێتو ئەنجامی خراپی لێدەکەوێتەوە.

ئەوە دەردی (بەرجەستەکاریی)ە کە مالیکی کوڕی نەبی ئاگادارماندەکاتەوە لێی:

(بەرجەستەکردنی بیربـاوەڕێکی زینـدووی خـاوێن لـە خەڵکێکی ناخاوێندا، یان لە ڕواڵەتگەلێکی کەم سوود لە کـاتو شـوێنێکی دیـاریکراودا)، کەچـی ئـەم حاڵەتـە بەداخـەوە لـەبیری هەنـدێك کۆمـەڵی سـەلەفیە هاوچـەرخەکاندا زاڵـە، کاتێـك دەڕواننـە مێـژووی پێـشینانمان، هـەروەها لـە واقیعـی هەنـدێك بزووتنـەوە ئیـسلامییەکاندا هەیـە لـە کـاتی روانینیـان بـۆ رواڵـەت و کەسـایەتیەکانیان، مامۆسـتا عەبـدوڵڵا نوفەیـسی جـوان هەسـتی بەمـە کـردووە کـە دەڵێـت: (پێویـستە جیـاوازی بکرێت لە نێوان ئایین وەك بیروباوەڕ و ئامانج و لە نێـوان رێکخستن وەك رێکخراو و هۆکار، ئایین ناکرێت رەخنـەی لێ بگیرێت، بـەڵام لەبـەر ئـەو تێکەڵکردنـە روویـداوە لـە نێوان ئایین و ڕێکخـستندا وایلێهـاتووە نابێـت رەخنـە لـە

ڕێکخـــستنیش بگیرێـــت! ! کەواتـــە دەبێـــت ڕەخنـــە لـــەخۆگرتنی نـــاوخۆیی هانبـــدرێت و بـــوار بـــۆ هـــەموان بکرێتـــەوە کـــە ئـــەم مافـــە سروشـــتییە بـــەکاربهێنێت، کـــە هەموو ڕێکخستن و کۆمەڵ و حزبەکانی ئەمڕۆ دانیان پێدا ناوە)[٢].

## نهێنی و ئاشکرا

گرفتێکـــی ســـەرەکی کـــە بـــەرۆکی بزووتنـــەوە ئیـــسلامییەکان دەگرێـــت و بـــەرەوڕوویان دەبێتـــەوە مەسەلەی نهێنی و ئاشکرا بوونە لە کاردا، سنووری نێوان هەردووکیانە، بنەما بڵاوەکەش لەم مەسەلەیەدا وتەکـەی پێشەوا حەسەن بەننایە کە دەڵێت: ئاشکرایی بانگـەواز و نهێنی جوڵانەوە.

بانگەواز لەم ڕووەوە دەبێت ئاشکرا بێـتو بـە ڕوونـی دیـار بێـت، نهێنییـەکانی سروشـتی ئیـسلامی لـە دڵ و

[٢] النفيسي: الإخوان المسلمون في مصر التجربة والخطأ، ضمن كتاب (الحركة الإسلامية رؤية مستقبلية، ص٢٥٩).

دەروونەكاندا ببزوێنێت، ڕێگای بەرەو خوا رۆیشتن بە جوانی رۆشن بكاتەوە و بەڵگەی تەواو لەسەر ناحەز و دوژمنانیش دارێژێت. بەڵام بزاوتن دەبێت نهێنی بێت، بۆ پاراستنی ئایندەی بانگەواز و یەكخستنی توانای بانگخوازان و پاراستنیان لە پیلانی ستەمكاران.

بێگومان سەركەوتن لەم هاوكێشەیەدا ئاسان نییە، چونكە هەندێك لە ئیسلامخوازان پەنا بۆ پەنهانیەكی بێ ئەندازە دەبەن لە پەرۆشییان بۆ چۆنیەتی و پاراستنی ئەو سەرمایەیەی بەدەستهاتووە، هەندێكی دیكە بەپێچەوانەوە مەیلی ئاشكراییەكی بێ ئەندازە دەكەن بەهیوای بەرفراوانبوون و دەستكەوت، زۆرجار ڕێڕەوی یەكەم تووشی چەقبەستوویی و دووهەمیش پاشاگەردانی دەبن.

لەڕاستییدا بنەما لە كاری ئیسلامییدا ئەوەیە لە حاڵەتی سروشتییدا پێویستی بە نهێیبوون نییە، چونكە پەیامەكە خێروبێرێكی بەربڵاوە بۆ هەموو لایەك، مافی هەموو لایەكیشە لێی ئاگادار بن و بەرهەمەكەی ببینن و

بیچننەوە، هەروەها کاری نهێنی بانگەواز وەك (تاوان) لێدەکات و مەترسیی وریابوون لە هەڵگرانی قووڵ دەکاتەوە، بەڵام لە حاڵەتی ناسروشتی و تاکڕەی و ستەمکاری کە ئەمڕۆ لە وڵاتی مسوڵمانان‌دا بڵاوە، کە دەسەڵاتداران بە ئارەزووی خۆیان و بەبێ ڕێگرێکی یاسایی و ڕەوشتی ئەم وڵاتانە بەڕێوە دەبەن، پێویستی بە بڕیاری ناچارییە لەگەڵ ئەم دۆخە نائاساییەدا، ناچاری شێوەیەك لە خۆپاراستن دەکات بەبێ زیادەڕۆیی و بەزایەدان.

ڕای پەسەند - خوایش دەیزانێ - ئەوەیە جیاکاری بکرێت لە بوارەکانی نهێنی و ئاشکرادا و بەشێوەبەکی روون نهێنی قەتیس بکرێت لە خانەی سەرکردایەتییەکی لێوەشاوە و چەند دەزگایەکی دیاریکراو کە ئەرکی تایبەتیان لەسەر بێت، پاشان پەیکەری گشتی بزووتنەوەکە بەفراوانی و روونی جێبهێڵرێت بەشێوەیەك زۆرترین خەڵك لەخۆبگرێت، بەوانەشەوە کە بە لاوازی

گوێڕایەڵی بزووتنەوەکەن، یان ئامانجێکی لاوەکی لەگـەڵ بزووتنەوە ئیسلامییەکەدا کۆیکردوونەتەوە.

جـا ئـەم ڕێبـازە زۆر لـە قـازانجی بزووتنـەوە ئیسلامییەکانە و زۆریشیان پێویست پێیە لەو قازانجانە:

* ئەرکی خەڵك لەخۆگرتن ئاسان دەکات، بەهۆی ئەو کراوەییەی لەگەڵ کۆمەڵگەدا، خەڵکەکەش لـە نـاوەرۆکی پەیامو ئامانجەکانی تێدەگەن، کە لە بزووتنەوەی نهێنـی و داخراودا تێی ناگەن.

* شـکاندنی دیـواری دژایـەتی نێـوان بزووتنـەوەی ئیـسلامی و خـەڵکانی دی، کـە دکتـۆر عەبـدولوەهاب ئەفەنـدی لـە لێکۆڵینەوەیـەکی لەسـەر بزووتنـەوەی ئیـسلامی سـوودانی ئامـاژە بـەوە دەکـات: هـۆی دژایـەتیکردنی دوژمنـەکانیان ئـەنجامی کـەم زانیارییانـە لەسـەریان نـەك زۆری، ئەمـە ڕاسـتییەکە بەسـەر هـەموو بزووتنەوە ئیسلامییەکاندا دەچەسپێت با زۆرێکیان لەمـە نەگەیشتبن.

* بزووتنەوەی ئیسلامی دەگەیەنێتە ئەوەی بەشداری راستەقینەی گەمەی سیاسیی بێت، ئەمەش تەنها بەپشتیوانی جەماوەرێکی بەرفراوان دەکرێت، ئەم جەماوەرەش پەیدا نابێت بەبێ دۆزینەوەی کلیلی ئاوێتە بوون لەگەڵ کۆمەڵگە و دڵخۆشییان بەو هەنگاوە بوێرانەی بزووتنەوەکە ئەنجامی دەدات.

* بەهۆی ئەم هەموو ڕواڵەتییە ئاشکرا و فراوانەوە، نهێنییەکانی بزووتنەوە دەپارێزرێت لە دەسەڵاتدارە ستەمکارەکان (کە چاودێری جوڵەی دەکەن و لەکەمینان بۆی) قاڵ دەکات و سەرنجیان لەسەر نهێنییە راستەقینەکان لا دەدات.

کەواتە بنەما کلاسیکییەکەی ناو ئیسلامییەکان لەسەر (ئاشکرایی بانگەواز و نهێنی رێکخستن) بەو رەهاییە نابێت:

* چونکە ئاشکرایی بانگەواز بەشێوەیەکی هەمەکی مومکین نییە، لەبەرئەوەی بزووتنەوە جارجار پێویستی بە پەیوەندی کردنی تایبەتەوە بە کەسانێکی تایبەت

هەیە، کە شوێنو پلەیان ڕێگە بە پەیوەندیکردنی ئاشکرا نـادات، هـەروەها بەنامـەی پێکهێنـەری دەبێـت هەنـدێك شتی تیابێت باش نەبێت دەربخرێت، لەوانەی پەیوەنـدی بە دروستکردنی هێزی نەوعیەوە هەیە کە بتوانێت بـەرەو ڕووی زەبری داپڵۆساندن و تاکڕەوی ببێتەوە.

* هـەروەها نهێنـی بـزاوتن (ڕێکخـستن) بـە ڕەهـایی نابێـت، چـونکە پێویـستی بـە زەقکردنمـەوەی کۆمـەڵێك سەرکردەیە کە ببن بە سمبول و کەسایەتی ناو کۆمەڵگە، بەهەمانشێوە پێویـستەکۆمەڵە بانگخوازێـك ببنـە زمـان و هەنگاوەکانی تێکۆشـەرانێك نوێنەرایـەتی تێڕوانینـی ئـەم بۆ ئازادی و دادگەری کۆمەڵایەتی بکەن.

کەواتە قورسە ئەمانە بە پەیوەندی ڕێکخستنی نهێنی بـشارێنەوە، چـونکە کارەکـەیان دەرخـستن و ناوبـانگ پەیدا کردن دەخوازێت و هەمیشە دیدار و بە یەکگەیشتن ڕوودەدات بۆیە زۆر سەختە ئەم کەسانە بـشارێنەوە، جـا ئەگەر نهێنـی بزووتنەوەکـە لەمانـە دوورخرێتـەوە باشـتر دەتـوانن بـە زمـانێکی پـاراوتر بیرۆکـە و قەناعەتـەکانیان

دەربڕین و پلانە سیاسیی و کۆمەڵایەتییەکانیان بجولێنن بەبێ هیچ مەترسییەك لەسەر دەرکەوتنی نهێنی بزووتنەوەکە لەم پرۆسەیەدا.

بەم شێوەیە دەردەکەوێت کە بزووتنەوەی ئیسلامی بە مانای تەواو نهێنی نییە، نە پێویستە و نە لە بەرژەوەندیشیایەتی بەو شێوە بێت، بەڵکو گرنگ ئەوەیە هەندێك نهێنی هەیە دەبێت بیپارێزێت، رەنگە ئەو نهێنییانەش لەشێوەی کەسی یان بەرنامە یان پلان و دەستەیەکی تایبەتدا بێت، ئەوەی لەسەر بزووتنەوەکەیە ئەوەیە کە نهێنییەکانی دیاریکراو بن و هەوڵی بەدەستهێنانی کۆمەڵگە یان بەشی زۆری بدات، جا هەرچەندە ئەو نهێنییانە کەمو قەتیسکراو و دابڕاو بن لە کاری ئاشکرا ئەوەندە پارێزراو دەبن، بزووتنەوەکەش چەندە لە ڕووی کۆمەڵگەدا کراوە بێت و جەماوەری فراوان بکات، ئەوندە دەتوانێت ئەو نهێنییانە داپۆشێت وەك گەوهەرێکی بەنرخ لە بێخی دەریایەکی بەریندا.

بـەڵام دابڕینـی نهێنییـەکانی بزووتنەوەیـەك لـە کـاری ئاشکرایی، بەمانای ئیزدواجییەتی سـەرکردایەتی نایـەت، کە جڵەو بۆ دەزگای تایبەت شـل کـات بـە ویـستی خـۆی بازبـازێن بکـات و بـەکاری نـاقۆڵا بزووتنەوەکـە تووشـی کارەسات بکات، تا ئێستاش بێنـەو بـەردە لەسـەر ڕۆڵـی خوالێخۆشـبوان عەبـدوڕەحمان سـندی و مـەروان حەدیـد بەردەوامە، کـە چـەندە دەسـتیان هـەبوو لـە تێـوەگلانی هـەردوو بزووتنـەوەی ئیـسلامی میـسری و سـووریدا بـەو شەڕ و رووبەڕووبوونەوە ترسناکانەی کە دووچاریان بوو، ئەمـەش لەبەرئـەوە بـوو هەریەکـەیان سـەربەخۆ لـە سەرکردایەتی بڕیاریان دەدا و بەبێ دیسپلین دەبزاون.[٣]

ئەرکی بزووتنەوە ئیـسلامییەکانە بوارەکـانی نهێنـی و ئاشـکرا رێکخـەن و ئـەرك‌و تواناکانیـان لەیـەك دابـبڕن،

[٣] لەسەر رۆڵی عەبدوڕەحمان سندی سەیری دوو بۆچوونی جیاواز بکە لە نێوان ئەحمەد کامل (الإخوان المسلمون نقاط على الحروف) و صەلاح شادی لە (حصاد المر)دا.

بەشێوەیەك هاوكار و تەواوكاریی یـەكبن و پارێزگـاری لـە یەكبوونی سەركردایەتی و بڕیارداندا بكرێت.

ئــەم گونجاندنــە ئەندازەگیرییــە، بزووتنەوەكــە دوور دەخاتــەوە لــە دڵــەڕاوكێی تــرس‌و گومـانی نێـوان ئــەو و كۆمەڵگە، چونكە ئاسایشی ستراتیجی بزووتنەوە جـێگیر بونیــەتی بــە بــەرفراوانبوونی لــەناو كۆمەڵگەكەیـدا، تـا لەناوبردن‌و تەنگەتاوكردنی كارێكی ئەستەم بێت، چونكە رێگـەكانی دیكـەی ئەمنیـەت كـە دەگیرێنەبـەر ـ چـەندە گرنگبن ـ بەڵام ئاسایش و خۆپاراستنی تەكتیكین.

كەچــی بــە داخــەوە بوارەكـانی نهێنــی و ئاشــكرا لــە بزووتنەوە ئیسلامییەكاندا زۆر تێكـەڵ و پێكـەڵ كـراون نــە نهێنی بە نهێنی و نە ئاشكرایە ئاشـكرا ماونەتـەوە، كاتێـك پێشەوا حەسەن بەننا لە رۆژنامەكاندا بەشان‌و باڵی هەندێك لە كادرە سەربازییەكاندا وەك صەلاح شادی هەڵدەدا، ئـەو سەركردە سەربازییانە وەك شادی خۆی فەرمان بە چاكە و رێگـری لـە خراپـەیان دەكـرد، وەك ئـەوەی لـە سـەردەمی خەلافــەتی عومــەر فاروقــدا بــژین نــەك مــەلیك فــاروق،

ئەمەیــشیان بــە ئاشــکرا ئــەنجام دەدا، ئــەم پرۆســەیە لەکاتێکدا بوو رێکخستنەکانی (ئیخوان) فیقهی بانگەواز و زانستە شەرعییەکانیان لە شانە نهێنییەکاندا دەخوێند؟ جا ئایا پەنـد لـەو ئەزموونانـە وەردەگـرین یـان هـەر دیلـی تێڕوانینی رابردو قسەکانیان دەبین؟

## ستوونی و ئاسۆیی

## العمق والامتداد

بزووتنـــەوە گۆڕانخـــوازە کۆمەڵایەتییـــەکان زۆرجـــار تووشــی گرفتێکــی کردەیــی دەبــن، کــە پەیوەیــستە بــە هەڵبژاردن لە نێوان بەرنامەی بژاردەیـەکی چۆنیەتی کـە بتەوی بناغە و جۆری کارەکە زامن کـات، بەرنامەیـەکیش جـەماوەرێکی زۆر کۆبکاتـەوە و ئەوەنـدە توانـای مرۆیـی هەبێت کە ململانێی پێ بکرێت، جا هەندێك بزووتنـەوەی ئیسلامی ئەوەندە ڕۆ دەچن لە پەرۆشی و بەدەستهێنانی جـۆر و چـۆنیەتیدا تـا مامەڵـەکردنیان لەگـەڵ واقیعـدا

لەدەست دەچێت و دەگۆڕێن بۆ دەستەبژێرێکی گۆشەگیر و دابڕاو لە جەماوەر.

خوێندنەوەی ئەزموونی بزووتنەوە ئیسلامییەکان بە سەرکەوتن‌و شکستەوە کۆمەڵێك پەندی بەکەڵکی لێوەردەگیرێت لە بواری راگرتنی هاوکێشەی نێوان ستوونی و ئاسۆیی لەوانە:

* بنەما ئەوەیە بەرنامەی بژاردەیی جۆریی لە ماوەی دامەزراندا پەیڕەو بکرێت، سوودی ئەمەش ئەوەیە: نموونەیی ڕیشەدار، پێگەیاندنی سەرمەشق، خەڵکی متمانەپێکراو، جڵەوی کار دەگرنە دەست، بەمەش بناغەی سەرەتایی بیناکە پتەو دەردەچێت، جا ڕاست‌و دروستی سەرەتا مەرجە بۆ سەرکەوتنی کۆتایی.

* پاش تێپەڕاندنی قۆناغی دامەزراندن و ڕۆشتنە ناو ململانێی سیاسی، پێویست بە کرانەوەی چەندێتی دەکات، کە ئاسانکاریەکی رێژەیی لە مەرجەکانی ئەندام وەرگرتن دەخوازێت، هەروەها کرانەوە پێویستە لە کەناڵەکانی پەروەردە و وەرگرتنی خەڵکە گشتییەکە،

هەروەك چۆن بانگەوازی ئیسلامی یەکەم لە سەرەتادا تاك تاك خەڵك دەهاتنە ناوی بەڵام لە دواییدا پۆل پۆل لەئامێزیان دەگرت.

* جیاکاری لەنێوان بەرنامەی ستوونی و بەرنامەی ئاسۆیی تەنها پەیوەست نییە بە کاتەوە، کە ئەمیان لە قۆناغی دامەزراندن و ئەویان لە قۆناغی ململانێی سیاسیدا بێت، بەڵکو بە هەمانشێوە جیاکارییەکی وەزیفیشە، چونکە هەریەك لە ستوون و ئاسۆ بوار و قەبارەی خۆی هەیە، لەبەرئەوەی هەندێك دەزگای تایبەتی بزووتنەوەیی هەمیشە پێویستی بە مەرجی توند هەیە بۆ وەرگرتنی ئەندام، هەندێك دەزگاش هەن سروشتیان ئەوەی پێویست نییە، بەڵکو ئەگەر بەکراوەیی کارلێکردنی، لەگەڵ کۆمەڵگەدا نەمێنێتەوە زیانی پێدەگات و دەشخنکێت.

* هەرچەندە داخوازییەکانی کرانەوە تەماحگیربن، ناکرێت بە تەواوی دەست لە پەیکەری بزووتنەوەکە دەربهێنرێت، بەتایبەت هەندێك دەزگای تایبەت کە

ئاینــــدەی کــــاری ئیـــسلامی و ئاراســـتەی ســـتراتیجی بزووتنەوەکەی پێوە بەندە، بەڵام دەزگا گشتییەکانی کــار بــا فــراوان بــبن و بکرێنـــەوە بـــە ڕووی هـــەموو ئارەزوومەندێکـــدا، تـــا گوتـــاری بزووتنەوەکـــە پـــەل دەهاوێژێت بۆ ناو هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگە، بەڵام ئاراستەی دەزگاکانی بزووتنەوە لە دەستی تاکی پێگەیشتووی خۆیدا دەمێننەوە، بەو مەرجەی ئەمانە بەو ئەزموونە جۆریەی هەیانە بتوانن سەرکردایەتی بکەن و ئاراستەی ئەو چەندیەتەی کە لەدەوریان کۆبوونەتەوە بکەن، پاراستنی پەیکەری بزووتنەوەیی نهێنی لە کاتی کرانەوەی ئاشکرادا بیرۆکەی (ڕێکخستنی هاوتەریب) دەخوازێت بە هەموو پێویستییە ئەمنی و شارەزاییە سیاسی و گونجاویە ئیداریەکەیەوە.

* بزووتنەوەی ئیسلامی لە هەر قۆناغێکدا بڕیاری کرانەوەیدا دەبێت لەسەر پلانێکی ئاراستە کراو بێت تا نەبێت بە پاشاگەردانی و لەگەڵ ستراتیجیەتی گشتییدا بگونجێت، هێشتا دەبێت ئاراستەی هەندێك کەرتی

دیـــاریكراوی هـــەبێتو تـــەركیز بخاتـــە ســـەر هێزێكـــی كۆمەڵایەتی تایبەت لەبەر گرنگییەكەی.

* هاوتـەریبی ڕاگـرتن لـە نێـوان سـتوونی و ئاسـۆییدا پەیوەستە بـە دۆخـی سیاسـی و ئەمنییـەوە، جـا ئەگـەر ئـازادی سیاسـی بـواری پێـدرا و مەترسـی داپڵۆسـاندنی ئـــەمنی كـــز بـــوو پێویـــستە خێـــرا ڕوو لـــە ئاســـۆیی و پەلهاوێشتن زۆرترینی خەڵك لەخۆگرتن بكرێت.

بەپێچەوانەشەوە ئەگەر بەرتەسككردنەوەی سیاسی و داپڵۆساندنی ئەمنی پەرەی سەند، ئەوكات ئاراستـەكردن بـــــەرەو ســـــتوونی پێویـــــستە، بەخۆداچـــــوونەوە و قووڵكردنەوەی پێگەیاندن و بتەوكردنی ریزەكان.

بـــەم شـــێوەیە هەمیـــشە دەرگـــای خێـــر لەبـــەردەم بزووتنەوەی ئیـسلامیدا كراوەیـە، لـە بـارودۆخی ئازادیـدا بەرەو پەلهاوێشتن و فراوانبوون لە بارودۆخی ستەمكاریی و چەوساندنەوەشدا بەرەو ستوونی و پێگەیاندن.

## گشتێتی و تایبەتی

بزووتنــەوە ئیــسلامییەکان لــە بیروبــاوەڕ و بنــەمادا یەکدەگرنــەوە، بــەڵام لــە تەمــەن و ئــەزموونو قــەبارە و پێکهاتەدا جیاوازن، جگە لە جیاوازی هەموو کۆمەڵگاکان کە بزووتنەوە ئیسلامییەکان تیایاندا دەبـزوون، لـە ڕووی باکگراونــدی مێــژوویی، گەشــەی ڕۆشــنبیریی، ڕژێمــی سیاسی، گەشە ئابووری و پێکهاتەی کۆمەڵایەتییەوە.

کەواتە پێویستە لەنێوان ئەم بزووتنەوانـەدا لێکـچوون و جیاوازی هەبێت، هەروەها یەکبوون و ڕەنگـاو ڕەنگـی، گشتێتی و تایبەتی، جا چـۆن لـە نێـوان ئـەم جیـاوازی و ئیزدواجییەتانەدا گونجاندن دروست دەکرێت؟

گومـانی تێـدا نییـە هاوتــەریبی لـە نێـوان ناوچـەیی و جیهانی بوون، لە نێوان ئەرکی خۆماڵی و ئەرکی برایـەتی

و پشتیوانی جیهانی، پێویستن، بەڵام ئەم هاوتەریبییە بەجێهێنانی نارِەحەتە کەواتە ئەگەر بەرژەوەندییەکان هاودژبوون چارە چییە؟ لێرەوە دەردەکەوێت کە بزووتنەوەی ئیسلامی دەبێت تایبەت بەسەر گشتییدا زاڵکات، بە زاڵکردنی کاریگەریی کردەیی بەسەر دروشمە گشتییەکاندا، ئەمەش بە راساندنی لە قورئانی پیرۆزەوە کە فەرمان بە پێغەمبەرەکەی دەکات کە لە سەرەتاوە خزمە نزیکەکانی بترسێنێت و فەرمان بە زاناکان دەکات کە لە قەومەکەیانەوە دەست پێ بکەن.

هەروەها بەرژەوەندییە کردارییەکان وەها دەخوازێت، هەموو بەڵگەکان دەیسەلمێنن کە گرفتی بزووتنەوە ئیسلامییەکان گرفتی چەندێتی و بانگهێشتکردنی جەماوەری لە ئاستی نێودەوڵەتی نییە، بەڵکو گرفتی چۆنیەتی و کاریگەریی واقیعی ناوخۆی وڵاتەکەی هەیە.

تەرکیزکردنە سەر کێشەی ناوخۆیی، بزووتنەوە بەهێز و زیندوو دەهێڵێتەوە، هەموو شوێنکەوتنێکی

سەرکردایەتی نێودەوڵەتی و هەرێمایەتی لەسەر حسابی خەمە ناوخۆییەکان هەڵەی کوشندەن.

هەندێك لە بزووتنەوە ئیسلامییەکان هەستکردن بەو شوێنەی تێیدا دەژی بیرچووەتەوە ئەمەش پلەبەندی گرنگییەکانی لێتێکداوە، زۆر لە بزووتنەوەکان لەسەر ئەمە تووشی لاوازی سیاسی و رێکخراوەیی کەڵەکەکراو بوون، چونکە هەندێکیان پابەندییەکی حەرفیان هەیە بەشێوەی بزاوتنی بزووتنەوە کۆنەکان و زاتی خۆجیاکردنەوەیان تەنانەت لە شتە لاوەکییەکانیشدا نییە کە واقیعەکە داوای ئەو جیابوونەوەیە دەکات، لەمبارەیەوە دکتۆر حەسەن مەکی نموونەیەکی بە مانای هێناوەتەوە:

لە کۆتایی چلەکانی سەدەی رابردوودا هەندێك لەسەرکردەکانی بزووتنەوەی برایانی موسڵمانی سوودانی ویستیان لە دەسەڵاتی داگیرکاری ئینگلیزی مۆڵەتی یاسایی بۆ رێکخراوەکەیان وەربگرن و بارەگایەك بکەنەوە، بەڵام سکرتێری کارگێڕی ئینگلیزی وتی: ئەگەر

سەربەخۆیی رانەگەیەنن لە بزووتنەوەی ئیسلامی میسری مۆڵەتتان نادرێتێ، چونکە ئەوان بە گرفتی ساڵی ١٩٤٨دا تێدەپەڕین و دەسەڵاتی ستەمکاریی پاشایەتی میسر شەرعیەتی مۆڵەتی لێوەرگرتبوونەوە، کەچی رێکخستنی سوودانی زاتی راگەیاندنی سەربەخۆبوونی نەکرد تەنانەت لە رووی تەکنیکیشەوە، تا کەمێك ئازادی جوڵانەوە بۆ خۆی بەدەست بهێنێت.[٤]

دکتۆر مەکی ئەوەی بەوە بەستووەتەوە کە بانگەوازی ئیسلامی هێندە بە رووداوەکانی دەرەوە کاریگەر بوو ئەوەندە سەرقاڵی پێویستییە ناوخۆییەکان نەبوو بوو.[٥] ئەمەش دیاردەیەکە بە داخەوە تا ئێستاش زۆر لە بزووتنەوە ئیسلامییەکان پێوەی دەناڵێنن.

لەڕاستییدا جیاوازی سروشتی کۆمەڵگە ئیسلامییەکان جۆری کاروباری گونجاو دیاری دەکات و پێویستی دەکات

---

[٤] الدكتور حسن مكي (حركة الإخوان المسلمين في سودان ١٩٤٤ـ ١٩٦٩، ص٦، سنة ١٩٨٢).

[٥] هەمان سەرچاوە، ص١٥٢.

هەموو بزووتنەوەیەکی ئیسلامی مامەڵەیەکی تایبەت لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگەکەی خۆیدا بکات و هۆکاری گونجاو دابهێنێت بۆ ئەو مەبەستە، دوور لە چاولێکەری مامەڵەی واقیعی شوێنی تر، یان هۆکارێکی نەگونجاو بگوازێتەوە بەبێ چۆنیەتی و گۆڕانکاریی، یان خۆی سەرقاڵ بکات بە کاروباری موسڵمانانەوە بە گشتی لەسەر حیسابی ئەرکە تایبەتییەکانی خۆیان.

بەڵام بەداخەوە هەندێك بزووتنەوەی ئیسلامی لەم جیاوازییە بێ ئاگایە لە ڕووی پراکتیکییەوە وەك دوکتۆر موحەممەد عەمارە دەڵێت: (ڕوو لە دیدێکی نەزەری دەنێت بە چاوکردن لە ئایینی ئیسلام کە ئایینی جیهانی ئیسلامیە، کەواتە لەگەڵ وڵاتەکەی ئەویشدا یەکن جیاوازی نابینێت لە ئاستی گەشەسەندن و جیاوازی دابونەریتو ڕێچکەو تێڕوانیندا)[٦].

[٦] د. محمد عمارة (من مظاهر الخلل في الحركات الاسلامية المعاصرة)، ضمن كتاب الحركة الاسلامية روئية مستقبلية، ص٣٣٦.

بۆیــه ســەیر نییــه لەگــەڵ ئــەم بێئاگاییــەدا ئــەو بززوتنەوانـه بخزێنـه نـاو ئـەم خەیاڵانـەوە و دوور بـن لـه واقیع و به پێوەری بانێکـه و دوو هـەوا بجولێنـەوە، بـەو شـێوە لـە پلـەی گـشتێتی و تایبـەتی ناگـەن و کـەلێنی گەورە لە پلەبەندی بابەتە گرنگـە کردەییەکانـدا دروسـت دەبێت بەهۆی دەردی چاولێکەرییەوە.

* دەبیـــنین فـــلان بزووتنـــەوەی ئیـــسلامی خـــۆی سەرقاڵکردووە بە ئامۆژگـاری و پـەروەردەی ئـەخلاقی و پێگەیانـدنی تـاك، هەرچـەندە کۆمەڵگەکەشـی لـە بـواری پابەندی ئەخلاق بەرزی گشتییدا بە بەراورد بـە کۆمەڵگـە ئیسلامییەکانی دیکەی کۆن و نوێ باشتر بێت، لەکاتێکدا باشتر وەهابوو روو بکات لە چاکسازیی سیـستمی گـشتی و بنیـاتی کۆمەڵگــە لەســەر بنــەما ئیــسلامییەکان نــەك دەمارگیریی هۆزایەتی نا ئیسلامی.

* یــان بزووتنەوەیــەك دەبینیــت پەرۆشــی ئــیرادە بەرزکردنەوە و سۆز جولاندنی خەڵکـە، کـە وەهـا چـاکتر بـوو خـەریکی رێکخـستنو پتـەوکردنی بناغـە و یـەکڕیزی

بێت، بۆ خۆپاراستن لـه پارچـه پارچـه‌یی و پـرژوبڵاوی، وه‌ك ئاماده‌ســازییه‌ك بــۆ كــاتی ته‌نگانــه‌ و ناڕه‌حــه‌تی رۆژگاری رووبه‌ڕووبوونه‌وه‌.

* یــان بزووتنه‌وه‌یــه‌ك كــه‌ ده‌رووی لێكراوه‌تــه‌وه‌ و ئازادییـه‌كی ڕێـژه‌یی لـه‌ وڵاته‌كه‌یدا بـه‌رپا بـووه‌، كه‌چـی هێـشتا لــه‌ كونوقــوژبنی ئه‌شـكه‌وته‌ نهێنییه‌كانـدا خـۆی شــــاردووه‌ته‌وه‌، نــــه‌بادا وه‌ك ئــــه‌زموونی بزووتنــــه‌وه‌ ئیسلامییه‌كانی وڵاتانی دیكه‌ بارودۆخی ئه‌منی تێبكچێت، له‌كاتێكدا باشتر وابوو ئه‌و ئه‌ندازه‌ ئازادییه‌ بقۆزێته‌وه‌ بۆ چــڕكردنه‌وه‌ی بانگــه‌واز و ده‌نــگ به‌رزكردنــه‌وه‌، بــه‌ڵكو ببێتـه‌ بزووتنه‌وه‌یـه‌كی جـه‌ماوه‌ریی كـه‌ تاكـه‌ زه‌مانـه‌تی پارێزراو بونیه‌تی.

* یــان بزووتنه‌وه‌یــه‌ك بــه‌ ڕه‌خــسانی ده‌روویــه‌كی ڕواڵــه‌تیی، خــۆی لێگــۆڕاوه‌ و لــه‌ هێــز پیــشاندان و خۆگه‌وره‌كردنـدا زیـاده‌ڕه‌ویی ده‌كـات، به‌مـه‌ش تووشـی رووبه‌ڕووبوونه‌وه‌ ده‌بێت كـه‌ پێـشتر حیـسابی باشـی بـۆ نه‌كردبوو، هێشتا هێزێكـی نـه‌وعی بـۆ پێكنـه‌هێنابوو كـه‌

بەرگـەی ئـەو پـەلامار و داپڵۆسـاندنە بگرێـت، بۆیـە ئەنجامەکەی بە قوربانییدانێکی زۆری خوێنڕشتن و کینـە دروستکردن تەواو دەبێت، کـە دەبنـە هەڕەشـە بـۆ سـەر ئاییندەی بانگەواز، بەڵکو بۆ کۆمەڵگەش.

* یـان بزووتنەوەیەکـە خەریکـە بـە چاکـسازیی بیروباوەڕ و موناقەشەی مردووەکان دەکات لەسەر بیدعە و لادانەکانیان، لە کۆمەڵگەیەکدا کە گرمـەی بیدعەچـێتی و تـاقمی عەقڵگـەرایی هـەر تێـدا نییـە، کـە دەبـوو ئـەم بزووتنەوەیـە شـەڕی لەگـەڵ داگیرکـەر و کلکـە سیاسـییەکانی کردبـا و خـەریکی چاکـسازیی سیـستمی سیاسی گەندەڵی بوایـە کـە لەسـەر سـتەمی بنەماڵـەیی و نەریتی نەفامی دامەزراوە و دەروازەی وڵاتـی واڵا کـردووە لەبـەردەم دوژمنـانی گەلـدا تـا بـە ئـارەزووی خۆیـان سەروەت و سـامانیان تـاڵان بکـەن و کەرامـەتیان ژێرپـێ بخەن.

# جودایی و گۆشەگیریی

بزووتنەوە ئیسلامییەکان پێویستیان بە جۆرێك لە جودایی (تمیز) و پێشکەشکردنی بەرنامەی جیاواز لەو باوو نەریتە بەربڵاو و فیکرە ئاساییە هەیە بۆ چاکسازیی کاروباری گەل و وڵات.

بەڵام جاری وا هەیە ئەم جوداییە بۆ هەندێك لە بزووتنەوەکان مەترسیی گۆشەگیریی و چوونە پەراوێزی کۆمەڵگە دروست دەکات، کەچی هەرکەس لە ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) بکۆڵێتەوە ـ کە سەرچاوەی بیرو رێبازی موسڵمانە ـ ئەم مەترسیی و گومانە بەدی ناکات، ئەو کاتێك لە سەردەمی پێغەمبەرایەتییدا لە مەدینەدا بوو کۆمەڵگەی مەدینە هەر لە ناو باوەڕدارەکاندا چەند جۆرێکبوون، ئاستی باوەڕ و لەخواترسانیان جیاواز بوو، هەیانبوو کەموکورت و هەشیانبوو مامناوەند و تیایشیا بوو پێشبڕکێی لە

چاکەکردندا دەکرد، بەڵام ئەم کۆمەڵگە هەمووی یان نزیك لە هەموو بەشداربوون لە پشتیوانییکردنی ئایین و سەرخستنیدا، هەرکاتێك هاواریان لێبکرایە مەگەر دوورڕوویەك یان خاوەن عوزرێك ئەگەرنا کەس دوانەدەکەوت، بۆیە رووداوی ئەو سێ کەسەی کە لە غەزا دواکەوتن ـ پێش ئەوەی خودا پەشیمان بوونەوەکەیان وەرگرێت ـ بۆ هەموان کارەسات و سەدمە بوو، هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کەوتوونەتە هەڵە و گوناهەوە بێ ئەوەی ئەو شتانە بیانخاتە پەراوێزی کۆمەڵگەوە یان دەرگای پشتیوان و سەرخستنی دینی خوایان لێ دابخات. ئەوەندە بەسە کە بزانین دوو کەس لەوانەی بەشداریی جەنگی بەدریان کردبوو لە دواییدا داری حەدی عەرەقخۆرییان لێدرا کە نوعەیمانی کوڕی عەمر[7] و قودامەی کوڕی مەزعون بوون ـ خودایان لێ ڕازی بێ ـ.[8]

---

[7] صحيح البخاري، ٢٤٨٨/ ٦.

[8] سنن البيهقي. ٣١٥/ ٨.

رەنگە یەکێك لەو نموونانەی مەترسیی جیاکاریی زەقکردووەتەوە و لە دیاریکردنی ستوونی و ئاسۆییدا سەرکەوتوو نەبووە، ئەزموونی کۆمەڵی ئیسلامی پاکستان بێت، ئەوان وا ڕاهاتوون کە ئەندامەکانیان بکەن بە دوو بەشەوە:

* (پایەکان) ئەندامە ڕێکخراوەکانن، کە لە دەستەبژێرانی ناو خەڵکن و پابەندی تەواویان بە ئیسلامەوە سەلماندووە و ماوەیەکی دوورو درێژ لەناو کۆمەڵدا ماونەتەوە و بەهێزی دامەزراوی خۆیان لەسەر مەبدەئو قووڵی گوێڕایەڵییان بۆ سەرکردایەتی سەلماندووە.

* (هاوڕایان) (المتفقون) ئەو ئەندامانەن کە سەر بە کۆمەڵ و لەگەڵ بیروباوەڕیدان و پشتیوانی دەکەن، بەڵام هێشتا سەرکردایەتی وایانناببینێت کە شیاوی ئەندامێتی یەکجاری بن، لەبەر کەمی دینداری یان هۆشیاری یان گوێڕایەڵی.

ڕیشەی ئەم دابەشکردنە بۆ پەرۆشی مامۆستا مەودودی و هاوڕێیانی لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵ دەگەڕێتەوە، کە جیاکاری بکەن لە نێوان ئیسلام وەك پێناسێکی نەتەوەیی و نێوان ئیسلامێکی پابەندکار و سیستمی ژیان، چونکە دەوڵەتی پاکستانی لەسەر پێناسی ڕەسەنی ئیسلام بوون دامەزرا وەك محمد ئیقباڵ لە شیعر و پەخشانەکانیدا دەریدەبڕێت، ئیسلام بوو بە پێناسی سیاسی و نەتەوەیی رۆڵەکانی پاکستان تا لە پێناسی دەوڵەتی هیندووسەکان جیایان بکاتەوە، ئەم پێناسەیە بەردەوام بەشێکبووە لە پەیڕەوی هەموو هێزە سیاسییە پاکستانییەکان بە جیاوازییەکی زۆر لەوەی کێ بەڕاستییەتی یان نا، بەڵام مەودودی وای بۆ دەچوو بەتەنها سەربەخۆبوونی موسڵمانان و دامەزراندنی دەوڵەتێکی تایبەت بۆیان ـ لەگەڵ گرنگییدا ـ بەس نییە و مانای وانییە هەر بەوە دەبێتە دەوڵەتێکی ئیسلامی.

ئیسلامبوونی دەوڵەتی کارێکی گەورەترە لەوەی زۆرینەی دانیشتوان موسڵمان بن یان هەستێکی گشتی

هەبێت کە سەر بە ئوممەتی ئیسلامی بن، بۆیە ئامانج لـە دامەزرانـدنی کۆمـەڵی ئیـسلامی هـەر لـە سـەرەتاوە پێگەیاندنی بژاردەیەکبوو کـە گـەلی پاکستانی لـە مانـای راسـتەقینەی دەوڵـەتی ئیـسلامی تێبگەیـەنێت و سەرقافڵەیەتی بکات بۆ لای، بۆیە مـەودودی لـە گوتـاری دامەزرانـدنی کۆمـەڵی ئیـسلامی سـاڵی ١٩٤١دا ئامـاژەی بەوەدا کە ئێمە تەنها بەوەندەی کەسێك سـەر بـە ئـاینی ئیسلام بێت بە ئەندام وەریناگرین، بەڵکو دەبێـت ئەنـدام مانـا و پێویـستییەکانی وشـەی (لا الـە الا الله) بزانێـت و لانیکەمی فەرزە ئیسلامییەکان جێبەجێ بکات.

ئەمە قەیناکات، بەڵام وادیارە دوایی وشەکە کە(لا الـە الا الله) بوو بـە وشـەگەلێك و لانـی کەمەکـە بـوو بـە لانـی هـەرەزۆر، بۆیـە سـەرکردایەتی کۆمـەڵ مـەرجی ئەنـدام وەرگرتنی توندو سەختکرد تا هەموو سنوورێکی بەزانـد، لەگەڵ ئەوەی مـەودودی و هاوڕێیـانی بەوشـێوە بنـەمای قۆنـاغی دامەزرانـدنیان دادەڕێـژا، بـەڵام ئـەو هەسـتە

سیاسییەیان لەبیرچووبوو کە گەلی پاکستان لە هەموو گەلانی تر زیاتر بۆ ئیسلامیان هەبوو.

لەبەرئەو ئەزموونە تاڵەیان کە لەگەڵ هیندۆسەکاندا بەڕێیان کردبوو ئەو بارودۆخەش لە دەوڵەتیان تێدا دامەزراند، هەروەها گرنگی قۆستنەوەی ئەو هەستە گشتییەیان بە قازانجی کۆمەڵی ئیسلامی و بەرنامەکەی لەبیرچووبوو.

بە چاوپۆشی لە جیاوازی پابەندی خەڵکەکە بە ئیسلامەوە، کەوتنە داوی ئەو ترسی خۆجیاکردنەوەوە و تیایدا رۆچوون، بەبیانووی پەرۆشبوونیان بۆ پەروەردەکردنی جۆری و هۆشیارکردنەوەی قووڵ، بەمەش نەیانتوانی هاوسەنگی لە نێوان چۆنیەتی و چەندێتی یان ئاسۆیی و ستوونیدا دروستبکەن، بەڵکو تەنها جەختیان لەسەر جۆر و چۆنیەتی نەك چەندێتی دەکردەوە، بۆیە کۆمەڵی ئیسلامی نەبوو بە حزبێکی جەماوەری، بەڵکو (کۆمەڵە)یەکبوو، جا بەم هۆیەوە سەختی هەرەمی و داخراوی ڕێکخستنی زاڵبوو بەسەر

ناوخۆی کۆمەڵدا، زۆربەی ئەو هەوڵانەی بۆ چاکسازی و کرانەوە دەدرا بۆ سوککردنی مەرجەکانی ئەندامبوون بێ ئاکام دەرچوون و سەرکردایەتی هەمیشە دەیوت گەر وا بکەین دەبینە حزبێکی جەماوەری وەك حزبەکانی دیکە.

بەوشێوە لە ماوەی سی ساڵی سەرکردایەتی مەودودی دا (١٩٤١ ـ ١٩٧١) ژمارەی ئەندامە ڕێکخراوەکانی کۆمەڵ لە دوو هەزار و پێنج سەد ئەندام تێنەپەڕی، دوای تێپەڕبوونی نزیکەی نیوو سەدەش بەسەر دامەزراندنیدا هێشتا ژمارەی ئەندامی ڕێکخراوەکانی کەمترن لە شەش هەزار ئەندام، لەکاتێکدا ئەوانەی سەر بە کۆمەڵ ن (هاوڕایان) نزیکە ٣/١ ملیۆنێك بوونەتەوە.

جا بیرکەرەوە بە لۆژیکی سەرکەوتنی سیاسی، باشە شەش هەزار ئەندام دەبێت لەناو گەلێکدا کە لە سەدو پەنجا ملیۆن کەس تێپەڕیکردووە دەتوانن چی بکەن؟

ڕاستە کۆمەڵی ئیسلامی پاکستان لە سەردەمی مەودودیدا لە ڕووی سیاسییەوە چالاکبوو، لە کۆمەڵێك

کێشەی گرنگدا سەرقافڵەیەتی ڕای گشتی کرد وەك: کێشەی دەستووری ئیسلامی، ریشەکێشکردنی قادیانیەکان، بەڵام ئەم توانا سیاسییە دەکرێت بۆ کاریزمایی و ئازایەتی کەسێتی مەودودی بگێڕینەوە، زیاتر لە هەرەمی رێکخستنە داخراوەکە.

بەم شێوەیە ئەم بزووتنەوەیە کە لە دێرینترینی بزووتنەوە ئیسلامییەکان و لە کاریگەرترینیشیانە، لە بازنەیەکی چەقبەستویی سیاسی بۆشدا بە بەردەوامی دەخولایەوە، بەڵکو پاشەکشەی دەکرد و جەماوەری خۆی لەدەست دەدا، هەڵبژاردنە پەرلەمانییەکەی ساڵی ١٩٨٨ی پاکستان نیشانەیەکی گەورەی ئەم بۆچوونەیە، کە کۆمەڵ تەنها هەشت کورسی بەدەستهێنا، هەروەها لە هەڵبژاردنەکەی ١٩٩٠یشدا، کەچی بەوانەشەوە نەوەستا لە ساڵی ١٩٩٣ بۆ سێ کورسی دابەزی.

ئەنجامی کۆتایی هەموو ئەمانەش ئەوەبوو کە پاکستان نەبوو بە دەوڵەتێکی ئیسلامی، هۆکەشی دەستەوسانی (کۆمەڵ) بوو کە نەیانتوانی کاریگەریە

مێژووییەکــە بقۆزنــەوە لــەم ئاراســتەدا، نەشــبوو بــە دەوڵـەتێکی تـەواو عـەلمانی هـەر لەبـەر ئـەو کاریگەرییـە مێژوویيــە، چـونکە عەلمانيـەت لەگـەڵ بـوونی دەوڵـەتی وەهادا کە پێناسی جیا بێت لە دوژمنە مێژووییەکـەی کـە هيندستانە هاودژ دەردەچوو، بۆیە تا ئێستا پاکستان بە تێکەڵەيی ماوەتەوە بە وێنەی نەیجیریا، کـە لـەو بـارەوە لە عوسمان بن فوديويان پرسی وڵاتەکەکـەت (نـەيجيريا) دارولئیسلامە یان دارولکوفرە وتــی: نـە ئەمـە و نـە ئـەو، بەڵکو تێکەڵەیەکە لە هەردووکیان.

ئــەوەی ئێیــستا جێگــەی دڵخۆشــییە ســەرکردایەتی (کۆمــەڵی ئیـسلامی پاکـستان) خەریکـە لـە قـووڵی ئـەو کێشەیەی کە کۆمـەڵ خـۆی تێخستووە تێـدەگات، بۆیـە مەرجی ئەنـدامێتی سـووککردووە و دەرگـای نەرمکێـشی ناوخۆیی کردووەتەوە کە ئومێد هەیـە کۆمەڵـە خـوێنێکی نـوێ و نەوەیـەکی تـازە بـچنە پێـشەوە کـە لـە يارييـە سیاسییەکەدا لە نـەوەی دامەزرێنـەران هۆشـیارتربن، لـە ڕاپــۆرتێکی هەڵــسەنگاندندا کــە کۆمــەڵ لــە پێگــەی

ئەلیکترۆنی خۆیدا ساڵی ۲۰۰۰ بڵاویکردووەتەوە، دان بە هەڵەکانی رابردوویدا دەنێت و وادەی چاکسازیی لە ئایندەدا دەدات، تیایدا هاتووە: کۆمەڵ کاریگەرییەکی بەهێزی لەسەر کەرتە رۆشنبیرەکە هەبوو، بەڵام لەسەر خەڵکە گشتییەکەی کەم بووە و پێویستی بە فراوانبوون و پەلکێشان هەیە، بۆیە کۆمەڵ گوتارێکی سیاسی نوێی لەم بارەوە دارشتووە، هەرچەند ئەمە هەوڵێکی باشی دەوێت تا بەسەر جەمسەری هێزە کلاسیکیەکەی ناو کۆمەڵ دا سەرکەوێت، چونکە رەفتارو فکری کۆمەڵ هێشتا نەگۆڕاون بۆ هێزێکی سیاسی خاوەن قورسایی.

ڕاپۆرتەکە بە دانپیادان بە راستییەکی تاڵدا کۆتایی دەهێنێت کە ئەوەیە: ئێستا کۆمەڵ کاریگەریی بتەوی هەیە وەك هێزێکی ئایدۆلۆژی یان وەك گرووپێکی فشاری خاوەن قورسایی لەسەر شەقام، بەڵام تا ئێستا نەگەشتووەتە ئاستی هێزێکی سیاسی، ئەم ستراتیجییەتە نوێیە بەرهەمی باشی تا ئێستا هەبووە، پاش کۆنگرەی ۱۹۹۷ کە لەوکاتەوە کۆمەڵ ئەم

ئاراستەیەی پـەیڕەوکردووە، ژمـارەی ئەنـدامانی بـۆ دوو ملیــۆن کــەس بەرزبۆتــەوە، سەرکردایەتییەکەشــی بــە ئومێدە لە ئایندەیەکی نزیکدا بگاتە پێنج ملیۆن، بەمەش جەســتەی کۆمــەڵ ڕێکدەبێتــەوە و قۆنــاغێکی نــوێی گەشەســـەندن دەســـتپێدەکات، دوور لـــە ترســـی تایبەتمەندیی و شوێنەوارە خراپـەکانی گۆشـەگیری، لـەم ئەزموونەی کۆمەڵی ئیسلامی پاکستانەدا پەنـدێکی بـاش بـۆ بزووتنــەوە ئیـسلامییەکانی دیکـە هەیـە کـە هەقــە وەریبگرن.

# پایەندیی و دەستپێشخەریی

هەندێك لە بزووتنـەوە ئیسلامیە نوێیـەكان بـە میراتـی فیكـــری كـــۆنی موســـڵمانان و حاڵەتـــە سیاســـییە شـەرمهێنەكانیان كاریگـەرن، بۆیـە بەرپرسـانیان داوا لـە بەردەستانیان دەكەن كـە گوێڕایـەڵیان بـن، بـەبێ ئـەوەی بەرامبــەر بــەو گوێڕایەڵیــە ئازادیــان بــدەنێ، جــا ئــەم بزووتنەوانە لە ئەدەبیاتیاندا هەرباس لە مانای گوێڕایەڵی و پابەنـدی و دیـسپلینی حزبـی دەكـەن، ئەمانـەش لەگـەڵ دەستپێـشخەری و داهێنـانی تاكەكەسـی و مۆڵەتـدان بـە نەرمكێـشی پێویـست لــە پــەروەردە و ئاراســتەكردن و ڕێكارەكاندا هاوسەنگ ناكەن.

مــرۆڤ ئــەم ئاراســتەیەی پــێ ســەیرە، لــەو كۆمەڵــە بزووتنەوانــەدا لەســەر بنــەمای بــژاردەی ئارەزوومەندانــە دامەزراون، چونكە چاوەڕوان دەكرا ئەوەندەی چاویان لـە دەستپێـشخەریی و داهێنانــە ئەوەنــدە چــاویان لەســەر پابەنــدی و دیــسپلین نەبوایــە، لەبــەر ئــەوەی ڕێگــای گوێڕایەڵیكردنیان قەناعەت پێكردنە نەك زۆركاریی.

ئیتر کاتی ئەوە هاتووە بزووتنەوە ئیسلامییەکان ڕێـز لە پایەی تاك لـەناو پەیکـەری بزووتنەوەکەیانـدا بگـرن و بەرپرسـیارێتی بخەنـە ئەسـتۆیان بـەبێ سـڵەمینەوە، بـۆ هــەموو داهێنانێــك ئــازادی پێویــستیان پــێ ببەخــشن و متمانە بە دڵسۆزی و شـارەزاییان بکـەن، چاوپۆشـی لـە هەڵـەکانیان بکـەن کـە ئـەنجامی کارکردنیانـە، چـونکە زاڵکردنـی گوێڕایـەڵی بەسـەر ئازادیـدا و پابەنـدی بەسـەر دەستپێشخەریدا، ڕەنگە پارێزگاری لەو واقیعەی کە هەیە بکات، بەڵام هەرگیز پاڵنەر نابێت بەرەو باشـترکردن. لـە زیانەکانی ئەم زاڵکردنە:

* تـــاك ئەلتـــەرناتیفی ئـــەو واقیعـــە سیاســـی و کۆمەڵایەتییــە بــاوەی نــاو کۆمەڵگەکــەی نادۆزێتــەوە و بۆیشی ناگەڕێت، چونکە وا دەزانێت ئەو لە دوای ئـەوەی بـە ئـاگری سـتەمو گەنـدەڵی دەسـەڵاتداران داخ کرابـوو ئێستا لە سـایەی رابـوونی ئیـسلامیدا حەواوەتـەوە، ئـەم هەسـتەش کاریگـەریی نـەرێنی لەسـەر جوڵـەو بـزاوتن دروست دەکات.

* پاشـــان لەگـــەڵ دەستپێـــشخەریی و بڕیارەكـــانی بزووتنەوەكەدا تێكەڵ نابێت و هەستێكی نەرێنی لەسەریان دەبێت، ئەمەش ئەنجامێكی لۆژیكیی هەموو ستەمێكە، كە خەڵك یان بە كرداری ئەرێنی بەرەو ڕووی ئەبنەوە یـان بـە رووبەڕووبوونەوەی سەلبی دەكەن بەوەی لەگـەڵ ئامـانج و هەنگاوەكانیدا نابن.

* لــە ئــەنجامی هــەموو ئەمانەشــدا بیرۆكــەی بیــانوو هێنانـــەوە و هەڵـــە خـــستنە ســـەر خـــەڵك و بزربـــوونی بەرپرسیارێتی زۆر دەبن و دەكەونە سەرشانی بزووتنــەوە و سەركردایەتییەكەی.

* مانای گوێڕایەڵی تێكەڵەیەكە لە پێكهاتەی رازیبوونی دڵ و دیــسپلینی رێكخراوەیــی و دەبێــت هاوســەنگی لــە نێوانیاندا رابگیرێت، تـاوەكو بەرپرسـیارێتی بـە ئازادیـەوە نەتوێتەوە و سـەپاندنیش لـە ئیشی بزووتنــەوەدا دروسـت نـــەبێت كـــە لـــە بنـــەمادا كـــارێكی ئارەزوومەندانەیـــە. لەبەرئــەوەی ئــەمڕۆ تێگەیــشتنی گوێڕایــەڵی بــە مانــای وەرگرتنی نەرێنی و دیسپلینی سەپێنراو بەربڵاوە، كەواتـە

بزووتنەوە ئیسلامیەکان پێویستیانە بگەڕێنەوە بۆ راگرتنی هاوسەنگی، بە رێگای جەختکردنەوە لە خودیەتی تاكو رۆڵی کاریگەری بەبێ هیچ زۆرلێکردن و فشارێك، بەڵکو پاڵنەرەکەی هۆشیاریی و بەرپرسیارێتییەوە، بزووتنەوەی ئیسلامیش بە گرتنەبەری ئەم رێگایانە دەتوانێت هاوسەنگی راگرێت:

* دەستپێشخەریی ناوخۆیی هانبدات تا ئەندامان بزانن کە تەنها پابەندی بە سیستەم و پەیکەرەوە ـ لەگەڵ گرنگیشیدا ـ پێوەری پلەبەندی نییە، بەڵکو پێوەر دەستپێشخەری و داهێنان و هەوڵدانە بۆ پێشخستنی کاروان و پەیامی ئیسلامی بزووتنەوەکە.

* دوورگرتن لە توووند و سەختی فیکری و مەزهەبی لە پەروەردەکردنی تاکەکانیدا دەشبێت رایانهێنێت لەسەر قبولکردنی فرە بۆچوون و رای فیقهی و فیکری و کرداری و هەرگیز لەسەر رای پەڕگیر بەناوی نیازپاکییەوە نەیانهێڵێتەوە.

* پێش پلان و بەرنامەداڕشتن با داهێنان و دەستپێشخەریی هانبدرێت، رەخنەگرتن پەرەپێبدرێت، بۆئەوەی بایەخی راو شارەزایی خۆی بزانێت، تەنها شورا فەرمیەکە بەس نەبێت.

* گرتنەبەری لامەرکەزیەت کە بزووتنەوەکە لە رووی جوگرافی و ئەرکەوە بە چەند شێوەیەك بەشدەکات و دەسەڵاتێکی زۆر و ئازادیەکی فراوان لە بواری پەروەردەیی و شتی تریش بە لقەکانی دەدات.

* دەستهەڵگرتن لە بڕیاری پابەندکاری زۆر و قەتیسکردنی لە کاروبارە ستراتیجییەکاندا، واز لە کاروبارەکانی دیکە بهێنرێت بۆ لقەکان و یارمەتیان بدرێت بە ڕاوێژ و رادەربڕین بیٚ ئەوەی پابەند بکرێن.

بەڵێ هاوسەنگی ڕاگرتن لە نێوان ئازادی و سیستەمدا، لە نێوان ویژدان و دەسەڵاتدار، ئەمە مەرجی یەکەمی هەموو کارێکی داهێنانەی بە کۆمەڵە، بەراستی ئیتر کاتی ئەوە هاتووە بزووتنەوە ئیسلامییەکان ئەمانە بزانن و پرشنگی ئازادی و زیندوێتی بە ریزەکانیاندا پەخش کەنەوە.

# یەکبوون و جیاوازیی

ئەگــەر لــە دوانــەیی پابەنــدی و دەستپێــشخەریی دوورنەکەوینەوە، دوانەییەکی دیکە هەیە کە هەندێك لە بزووتنەوە ئیسلامییەکان لە باش مامەڵەکردن لەگەڵیدا سەرکەوتوو نەبوون، کە یەکبوون و جیاوازییە، جا بەشێك لە سەرکردەکانی ئەم بزووتنەوانە دیسپلین و ڕواڵەتی بە تاکە زامنی یەکبوون تێگەشتووە و لەکەمیندایە بۆ هەر لادانێك، هەموو جیاوازییەك لە ریزی بزووتنەوەکەیدا و بە دەرچوون لە گوێڕایەڵی و تێکدانی ریز و ئاژاوەگێڕی دادەنێت، نازانێت کارەکەی خۆی لەسەر گوێڕایەڵی ئارەزوومەندانە دامەزراوە، تەنانەت ئاگای لەوەش نییە کە جیاوازی و ڕاجیایی سونەتێکی خواییە بۆ بەندەکانی و گۆڕانکاریی بەسەر ئەو سونەتەشدانایە، جا یان دەبێت بە ئەرێنی و لە خزمەتی

کاروانەکـەدا بـەکاربهێنرێت یـاخود دەبێـت بـەبێ ئاکـام بەرەوڕووی بوەستێتەوە.

رەنگـە ئـەم سـەرکردانە هێـشتا مێـشکیان بـە بـیرە ئیـسلامیە مێژووییەکـە ئـاخنرا بێـت کـە تـا ئێـستاش کاریگـەرە بـە مەترسـی بـەرپابوونی ئـاژاوە بەشـێوەیەك گومانی خراپ بە هەموو هـەوڵێکی چاکسازیی زەروریـش دەبـــات، هـــەروەها گومـــانی خـــراپ بـــە هـــەموو رووبەڕووبوونەوەیەك دژی دەسەڵاتدار دەبات، تا گەشـتە ئەوەی بەشێك لە زانایانی ئەزهـەر پێیـان دروسـت نـەبوو بەرەنگاری داگیرکاری ناپلیۆن بکرێت کـاتی پـەلاماردانی میسر، بە بەڵگەی ئەوەی دەبێتە ئاژاوە، بەڵکو زانایەکی مۆریتـانی لەسـەردەمی داگیرکـاری فەرەنـسیدا کتێبێکـی خراپی لەوبارەوە نووسی نـاوی نـا (ئامۆژگـاری گـشتی و تایبـەت لـە نەجـەنگان دژی فەرەنـسییەکان ــ النـصیحة العامة والخاصة في التحذير مِنْ قتال الفرنسية) لـە کاتێکـدا ئەمـــەی نووســـی براکـــەی (کـــە ئـــەویش زانـــا بـــوو) سەرکردایەتی سوپای جیهادی دەکرد دژ بە داگیرکەران.

هۆیەكی دیكەی پەیدابوونی ئەم بیروبۆچوون و كارە ئەوەیە كە سەركردایەتی بەشێكی بزووتنەوە ئیسلامییەكان لە هەندێك ئەركی كاری ئیسلامی گەیشتووە و لە هەندێكیشی نەگەیشتووە، لە بایەخی دیسپلین و یەكبوون گەشتووە كە لە بنەما سەرەكییەكانی هەر رێكخستنێكن، كەچی لە هەردوو ئەركی دەستخستن و لەخۆگرتن لە (الإكتساب والإستیعاب) نەگەشتووە، چونكە هەر رێكخستنێك بە پارێزگاریكردن لەوەی هەیە ڕازیی بوو و ئەوەندەی پێ بەس بوو و دەستی ڕانەكێشا بۆ هێنانی خوێنی تازە و وزەی نوێ ئەوە بەبێ چەندو چوون بەرەو مردن دەچێت.

بزووتنەوە ئیسلامییەكان ئەمڕۆ پێویستیان بە دیدێكی جیاواز هەیە كە ڕاجیاییە ناوخۆییەكان بە مەترسی لەسەر یەكبوون نەزانن، بەڵكو بە قەڵغان و پارێزگاری بزانن، چونكە یەكبوونێك لەسەر تۆپزی ماددی یان مەعنەوی بنیاتبنرێت مانەوەی نییە، هیچ

گرنتییەکیش بۆ یەکبوون هێندەی هەڵقوڵانی لە ویـژدانی خەڵکەکەیەوە نییـە، بەمـەش ئـەم بزووتنەوانـە دەتـوانن پارێزگاری لە بتەوی ریزیان و یەك ئامانجی و هـەرەوەزی بکەن، واتە لە ڕێگەی جۆراوجۆری و ڕاجیایی کـە ئـازادی تاك‌و لقەکان مسۆگەر بکات، بەمەش بزووتنەوە سوود لە هـــەموان وەردەگرێـــت بـــەپێی توانـــا و ئامـــادەیی و تێگەیـــشتنی. زۆرتـــر لـــەو خەڵکانـــەش کـــە خـــوا و پێغەمبـەریان خـۆش دەوێـت لـەخۆدەگرێت بـە جیـاوازی ئاستی ئیمانداری و لەخواترسان و هۆشیاری و گوێڕایەڵی و سەلیقە و رابردوو ئەزموونی ژیانیان، خەڵکەکەش ناچار نابێت یەك رێچکە بگرنەبەر کە گیانی داهێنـان و بزاوتنـی خودی کە سەرچاوەی هەموو کارێکی رەسەنە دەکوژێت.

ئـــەم تێگەیـــشتنە لای هەنـــدێك لـــە بزووتنـــەوە ئیـسلامییەکان نـەماوە، ئـەنجامی ئـەم کەلێنـە فکریـە لارەسەنگی رێکخستنەی لێ بەرپا بوو مەرکەزیەتێکی زاڵ و دەسـتوەردانی سـەرکردایەتی کـە لـە هـەموو کـارێکی گەورە و بچووکدا بەرجەستەبووە.

گومانی تێدا نییە لە قۆناغی دامەزراندندا یەکشێوەیی هێز ـ وەك پێشتر وتمان ـ پێویستە بۆ بنج داکوتانی مانای کۆمەڵ لە ناخی ئەندامانـدا، پابەنـدبوونیان بـە سیستەمو گوێڕایەڵییەوە، بەڵام ئەم سەختگیرییە لە دوای بناغەدارِشتن مانایەکی نامێنێت.

کەواتە داواکراو لە بزووتنەوەی ئیسلامییەکان ئەوەیە لە قۆناغی دامەزراندندا سەختگیریی و یەکشێوەیی، لە قۆناغی پێگەیشتندا چاوپۆشی و ئازادکردن بکەن، چونکە بۆ هەر مەقامێك گوفتارێك پێویستە و هەموو سەردەمێکیش پیاوی خۆی دەوێت.

# پچڕاندن و گەیاندن
## الفصل والوصل

لایەنێکی بنەڕەتی دیکەی ڕێکخراوەیی کە بەرەو ڕووی بزووتنەوە ئیسلامییەکان دەبێتەوە، گرفتی پچڕاندن و گەیاندنە، مەبەستمان پێی بەتوانابوونی بزووتنەوەی ئیسلامییە لە لەیەك جیاکردنەوەی ئەو ئەرکانەی کە بەناو یەکدا چوون، بەڵکو دەبێت هەندێك لەو ئەرکانەش لە پەیکەری بنەڕەتی ڕێکخراوەیی جیا بکرێتەوە، لەگەڵ هێشتنەوەی پەیوەستبوونێکدا کە ئەو ئەرکبارە لە دوورەوە گوێڕایەڵی ئاراستەی بزووتنەوەکە بکات، مەسەلەی پچڕاندن و گەیاندنیش سێ مەودای هەیە، سیاسیو ئیداری، پەروەردە و پێگەیاندن، ئاسایشیو خۆپارێزی.

* لە بواری سیاسیو ئیدارییدا، بزووتنەوە ئیسلامییەکان پێویستیان بە فراوانکردنی بازنەی بنکەی جەماوەری هەیە، تا بتوانن ململانێی حزبو بزووتنەوە

سیاسییەکانی دیکەی پێ بکەن، بەڵام گرفتێکی ڕێکخراوەیی لەو کاتانەی بزووتنەوە ئەم بژاردەیە دەگرێتەبەر سەرهەڵدەدات، ئەویش گرفتی ئیزدواجییەتی سەرکردایەتی و ڕێکخراوەییە، کە ڕەنگە شپرزەیی هەنگاونانی ئیداریی دوانەیی بڕیاردان و گوێڕایەڵی لێ دروست ببێت، ئەمە ئەو شوێنەوارەیە لای ئەوانەی دەترسن کە ئەگەر بزووتنەوە خەڵکێکی زۆری ڕێکنەخراوی لەخۆگرت، ئەوان ئاراستەی بزووتنەوەکە بگۆڕن نەك ببنە پشتیوانی، باشترین ڕێگایەك کە زاڵمان بکات بەسەر ئەو مەترسییەدا جیاکردنەوەی سەرکردایەتی سیاسییە لە سەرکردایەتی ئیداریی، بە شێویەوەیەك با سەرکردایەتی سیاسی مامەڵە لەگەڵ کاروبارە سیاسییەکاندا بکات لەگەڵ ئەوانەش کە پەیوەستییەکی ڕێکخراوەییان بە بزووەتنەوەکەوە نییە، بەڵام سەرکردایەتی ئیداریی کاروبارە ناوخۆییە تایبەتەکان لەئەستۆ بکرێت.

بـەم لێکترازاندنـەش بزووتنەوەکـە بەسـەر پەیکـەری ڕێکخراوەیی خۆیدا زاڵ دەبێـتو لـە هەمانکاتیـشدا لـەناو بزووتنەوەیەکی جەماوەری کراوەشدا کار دەکات.

* لە بواری پـەروەردە و پێگەیاندنـدا، سـتراتیژییەتی پـــچڕاندنو گەیانـــدن لـــە زۆر کاروبـــاردا بەســـوودە، گرنگترینیـــان پـــچڕاندنی نێـــوان بـــواری پـــەروەردە و پێگەیاندنـە، کـە ئـەم پـچڕاندنە پێویـستە ، لەبـەر ئـەم هۆیانە:

- ئەرکی پەروەردە، ئەخلاقی و بیروباوەڕییە و ئەرکی پێگەیانـدن مەنهـەجی و کردارییـە، ئامـانجی پـەروەردە پابەندکردنە و ئامانجی پێگەیاندن بەکاربوونە.

- پـەروەردە ئاراسـتەی کۆمەڵگـە بەگـشتی دەکرێـتو تـــەنها لەســـەر ئەنـــدامان کـــورت هـــەڵناهێنرێت، بـــەڵام پێگەیاندن تـەنها ڕوو لـە ئـەو ئەندامانـە دەکرێـت کـە بـۆ بزووتنەوەکە یەکلابوونەتەوە.

- ئەرکی پەروەردە بەدەستهێنانی زۆرترین کەسە، بەڵام پێگەیاندن ڕاستەوخۆ ئامانجی بەدەستهێنانی ئەندامی نوێ نییە.

- پەروەردە ئەرگی بانگەوازی گشتییە کە فراوانکردنی مەیدانی خێرو چاکەیە لە دەروونی تاکەکانی کۆمەڵگەدا با نەشیەنە ناو بزووتنەوەکەوە، بەڵام پێگەیاندن تەنها بەهێزکردنی پسپۆڕی و شارەزایی ئەندامانی بزووتنەوەکەیە.

- بابەتی پەروەردە پەیوەندیی بە چاکە گشتییەکانی ئیسلامەوە و زیادکردنی زانستی شەرعی هەموو بیسەرانیەوە هەیە، بەڵام ناوەڕۆکی پێگەیاندن لەسەر شارەزایی سیاسیو ئیداری و هونەری کە ئەندامێکی کارا پێویستیەتی چڕ دەبێتەوە.

ستراتیژیەتی پچڕاندنو گەیاندن، پێویستی دەکات کە پەروەردە بەسەر کۆمەڵگەدا بکرێتەوە، تا کاری خێر بگشتێنرێتو ئالای سەرقافڵەیەتی بزووتنەوەکە لە کۆمەڵگەدا بە گشتی ریشە داکوتراو بێت، بەمەش

وردەکاریی لـە هـەردوو ئەرکەکـەدا بـە ڕێکـوپێکی بـەدی دێت: بازنەی پەروەردە فراوان دەبێت و پەیامی خۆی لە کۆمەڵگە دەگەیەنێت، پیگەیاندنی هونەریی زامن دەکرێت و لە کەسانی خۆیدا قەتیس دەکرێت.

* لـە بـواری ئاسـایش‌و خۆپارێزیـشدا، سـتراتیژییەتی پـچڕاندن و گەیانـدان پێویـستە، دەبێـت لامەرکەزییـەت بگیرێتــە بــەر وەك هۆیــەك بــۆ دڵنیــایی دژ بــە هێــزی داپڵۆساندن و ستەمکاریی، ڕەنگـە ئەوانـەی چـنگیان لـە بیری ڕێکخستنی کلاسیکی گیرکردووە کە لـە هاوکێـشەی نهێنی و ئاشکرا نەگەیشتوون، ئەمە بە بێسەرەوبەرەیی و بانگەواز تووشی مەترسیکردن بزانن، بەڵام خوێندنـەوەی مێژوویی و ڕێکخراوەیـی بزووتنـەوە ئیـسلامییەکان ئـەوە دەگەیەنێت کـە لامەرکـەزیی بـوون ئـامێرێکی دڵنیاکـاری زۆر سەرکەوتووە.

ئـەم لامەرکەزییبوونـە دڵنیاییـە ڕەنگـە لـە پـچڕاندنی قەوارەی ناوخۆیی بزووتنەوەکە و پەلهاویشتنی دەرەکیدا زیاتر دەربکەوێت، یان لە پچڕاندنی باڵە جیاوازەکانیدا لە

یەکتری، هەر باڵـە و بـەپێی تایبەتمەنـدیی ئـەرکی خـۆی جوانتر دیار بێت.

نموونەیەکی سەرکەوتووی جـۆری یەکـەم ئەوەیـە کـە بزووتنەوەی ئیسلامی سوودانی لـە حەفتاکانـدا ئـەنجامی دا بە پچڕاندنی نێوان سەرکردایەتی نـاوخۆیی و دەرەکـی خـۆی، ئەمـەش لـە سـەردەمی جەعفـەر نومێریـدا بـوو، کاتێك سەرکردایەتی بزووتنەوەکە لـە دەرەوەی وڵات بـە تەنـسیق لەگـەڵ حیزبـەکان (بـەرەی نیـشتمانیی) کـاری دەکرد و جەنگێکی سیاسـیو سـەربازی دژی ڕژێـم بـەرپا کـــرد و هـــیچ پەیوەندییـــەکی ڕێکخراوەییـــشی لەگـــەڵ ســـەرکردەکانی نـــاوخۆدا نـــەبوو، ئـــەم کـــارەش تـــا ئەندازەیـەکی بـاش ئاسایـشی سـەرکردایەتی نـاوخۆی زامنکرد و دەستوەشاندنەکانی نومێری لـە سـەرکردایەتی ناوخۆ دەستوەشاندنێکی شەلم کوێرم هیچ نـابوێرم بـوو، کاریگـەریی بەسـەر نـاوکی ڕێکخـستنی نـاوخۆوە نـەکرد، ئەمەش لەو هەوڵە کودەتاییـەدا دەرکـەوت کـە موقـەدەم (حەسـەن حـسەین) دژی نـومێری ئـەنجامی دا، یـان ئـەو

هەوڵەی پـەلاماردانی (بـەرەی نیـشتمانیی) دژی نـومێری دای لــە ٢ یۆلیـۆی ١٩٧٦، بزووتنــەوەی ئیــسلامی لــە هـــــەردوو هەوڵەکــــەدا ڕۆڵـــــی هـــــەبوو، کەچــــی دەستوەشاندنەکەی نومێری هەرچـەندە قـورس‌و فـراوان بــوو، بــەڵام کاریگــەری گــەورەی لەســەر ڕێکخــستنی بزووتنەوەی ئیسلامی لـە نـاوەوە نـەبوو، چـونکە لەگـەڵ سەرکردایەتی سیاسی دەرەوە لەیەکدی پچڕابوون.

بەڵام نموونە بۆ جـۆری دووهـەم کـە پـچڕاندنی نێـوان باڵەکانە، دوو نموونەی بەهێز هەیە لەسەر سـەرکەوتوویی کــە (بزووتنــەوەی بــەرگریی ئیــسلامی فەلەســتین - حماس)ە، هەروەها (بزووتنەوەی ئیسلامی ئیـسرائیل)ە، کــە لــە موســڵمانە فەلەســتینییەکانی ســاڵی ١٩٤٨ فەلەســتینی پێکــدێن، شــاراوە نییــە کــە ئــەم دوو بزووتنەوەیە لە سەختترین دۆخی ئەمنی ئـاڵۆزدا دەژیـن، لە ژێر چاودێری دەزگای ئاسایـشی نـاوخۆیی ئیـسرائیلی (شــین بیــت)دان، کــە یەکێکــە لــە بــەهێزترین دەزگــا ئەمنییەکانی جیهان لە تووندو تیژی و خوێنڕێژییدا، بەڵام

ئـــەم دوو بزووتنەوەیـــە سیـــستمی لامەرکەزییـــەتی ڕێکخراوەیی و خانەی کراوەیان پیادە کـرد، بـە ئامـانجی ئاسایـشی خۆپـارێزی بـە ئەزموونەکـەیان سـەرکەوتوویی ئەم ستراتیژییەتەیانی سەلماند، تەنانەت دوژمنیش دانـی بەم ڕاستییەدا ناوە، کە ناوەندی سـتراتیژییەتی (جـافی) لە زانکۆی تەلئەبیب سـاڵی ٢٠٠٠ لـە پێگـەی ئـەلیکترۆنی خـــۆی لێکۆڵینەوەیـــەکی بەناونیـــشانی (ڕادیکاڵیـــەتی ئیسلامیی لە ململانێی نیشتمانی)دا بڵاوکردووەتەوە، دوو نووسـەری ناوەندەکـە (ئامـار کـرز) و (نـەجمان تـال) ئامادەیـانکردووە، بـە گرنگییـەوە بـاس لـە پەیکـەری بزووتنـــەوەی بـــەرگری ئیـــسلامی (حـــەماس) دەکـــەن و دەڵـێن: (هـەر لـە سـەرەتای سـاڵی سـێهەمی سـاڵانی ڕاپەڕینـەوە، (حـەماس) خـەریك دەبێـت بـە سیـستمێکی لامەرکـــەزیی و دابەشـــکردنی دەســـەڵاتەوە، ئـــەم گۆڕانکارییانەش وەڵامدانەوەیەکی بەرگریکارانەیـە دژ بـە ئـەو هەوڵانـەی کـە هێزەکـانی ئاسایـشی ئیـسرائیلی دەیگرێتەبـەر لـە پێنـاو ڕێگـرتن لـە نێـوان حـەماس و

ریشەداکوتانی لەنێو کۆمەڵگەی فەلەستیینیدا، ئا بەم شێوە بزووتنەوەکە توانی خۆی بگونجێنێت لەگەڵ ئەو بارودۆخەی کە لە ئەنجامی رێکارییەکانی هێزی ئیسرائیلی لە دژی دەیانگرتەبەر، یان لە ئەنجامی ئەو لەمپەرانەی لە رێگای هەموارکردنەوەی رێکخستنەوە و گۆڕانکارییەکانەوە لە دابەشکردنی ناوەندی هێزەکانی..... پرۆگرامی کاری رێکخستنی (حەماس) بە تێپەڕبوونی سالآن دەردەکەوێت پشت بە بیرۆکەی پچڕاندنی نێوان باڵە بەرپرسەکانی بزووتنەوەکە دێت کە هەریەکەیان ئەرکێکی جیاوازی هەیە، جا ئەم پچڕاندنەش بوویە قەڵغانێك کە پەیکەری بزووتنەوەکەی لە دزەپێکدرنی جاسووسی هێزە ئەمنییەکانی ئیسرائیلی پاراست و لە هەمانکاتیشدا پەیوەندیی و تەنسیقێکی روون لە نێوان یەکەکان و پەیکەرە جیاوازەکانی بزووتنەوەکەدا دیارە، بەم شێوەیە بنەمای پچڕاندنی نێوان باڵەکان گوزارشت بوو لە لۆژیکێکی رێکخراوەیی تەکتیکی لە هەمانکاتدا.

هەر لە لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆی دیکەی (نەجمان تال) بەناونیشانی (بزووتنەوەی ئیسلامی لە ئیسرائیل) کە هەمان ناوەند لە هەمان مێژوو لە پێگەی ئەلیکترۆنی خۆیدا بڵاوی کردۆتەوە، نووسەر ئاماژە بەوە دەکات کە ژێرخانی ڕێکخراوەیی (حەماس) دوو جۆر شانە لەخۆدەگرێت، (شانەی کراوە) و (شانەی داخراو)، شانەی کراوە هەموو ئەوانە لەخۆدەگرێت کە لەژێر ئاڵای بزووتنەوەکەدان، بەڵام شانەی داخراو تایبەتە بە متمانەپێکراوانێك لەناو ئەندامانـدا کە ئامادەیی بوونە سەرکردایەتییان تێدایە و شانەی داخراو بە نهێنی کار دەکات و حەماسبوونی ئەم شانەیە بە هەموو شێوەیەك ڕەد دەکاتەوە.

جا ئایا بزووتنەوە ئیسلامییەکانی وڵاتانی خۆمان تووشی مەترسیی زیاتر لەم دوو بزووتنەوەیە دەبن؟ ئایا لە دوای ئەم دوو نموونەیە پێویست دەکات ئەندامانی بزووتنەوە ئیسلامییەکانی وانەی عەقیدە و فیقھ و سیرە لە ژوورە تاریکەکاندا بخوێنن؟ ئێمە بەم شێوە

بزووتنـەوەی ئیـسلامی لـە کۆمەڵگـە دادەبـڕینو گومـانو دیواری دەروونی لە نێوان خۆمانو خەڵکدا زیاتر دروسـت دەکەین، ئیتر لە چارەنووسیی بزووتنەوەیەکی گوڕانخواز مەپرسە کە لە کۆمەڵگەکەی هـەڵ بێـتو گومـانی خراپـی پێ ببات، چی بەسەر دێت!